www.alibapir.com

زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی هەژدەهەم

عەلی باپیر

# ڕەوەندی کورد

## لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی



التفسیر

www.alibapir.com



# ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی




نووسینی

**عەلی باپیر**






ناوی کتێـــــــب : ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی
نـــــاوی نوســـــــەر: عەلی باپیر
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیانـــدن/ هـەولێر
نەخشەسـازی نـاوەوە: عزالدین محمد
بــــــــــــــەرگ: ئەمین مخلص
نۆرە و ســـاڵی چـــاپ: یەکەم ١٤٣٣ك – ٢٠١٢ز
تـــــیـــــــــــراژ: ١٥٠٠ دانە



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٩٧) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر – شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



چاپکردنی پێشووی کتێبەکانی بەنەوعی بەگوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لەمێژبوو هیوادار بووم شێوەی چاپکردنێکی

وای لێ بێ بۆ بەرهەمەکانی کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانی تێدابێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵستا .

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص م

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم . خوا بەرەکەت و پێزی زیاتر

بخاتە ئیشی و کاریانەوە .

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نییە .

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ ﴾ الحشر

بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و با هەرکەسە تەماشا بکات چی بۆ بەیانی (قیامەت)پێشکەش کردوە ! وە پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، وە وەك ئەوانە مەبن کە خۆیان لەبیرچوو ئەویش خۆیانی لەبیر بردنەوە، ئا ئەوانە لەرێ دەرچوون.



# پێشکەشە

بەو خوشك‌و برایانەی هەندەران، کە نە ئێش‌وژانی وڵاتی غەریبایەتی‌و، نەخۆشیی‌و ئیسڕاحەتی ماددیی‌و ڕواڵەتیی، وای لێنەکردوون، کە خواو پێغەمبەرو ئیسلام‌و خێزان‌و خزم‌و خەڵك‌و نیشتیمانەکەیان فەرامۆش بکەن‌و، ئەرکی سەرشانیان لە بەرانبەریاندا لەبیربکەن.

# پێشەکی

الحمدلله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وبارك على المبعوث رحمة للعالمين محمد وآله أجمعين من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم!

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت دەقی وتارێکە کە لە ڕۆژی: (٢٠٠٦/٩/٢)ز لە شاری لەندەن لە هۆڵی (KCC) {مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کوردستان}دا، لەئێوارە کۆڕێکدا کە بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لەخوشك و برایانی کورد لەبەریتانیادا بەسترابوو، پێشکەشکراو، پاش هێترانە سەر کاغەزی و چاوپێداگێڕانەوەو (١) سووکە دەستکارییەکی خۆم بەمجۆرەی لێهات.

شایانی باسیشە کە من لە ساڵی (٢٠٠٢)ز دا، چەند ئامۆژگاریی و ڕێنماییەکی دیکەی گرنگم ئاڕاستەی خوشك و برایانی مسوڵمانمان لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا کردوون و، پێموایە هەردووك وتارو نامیلکەکە کۆمەڵە ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ و پێویستیان گرتوونە خۆیان، بۆ سەرجەم ئەو کەسانەی کە بەهەر هۆیەکەوە بووە، پەرپەوەو ئاوارەی هەندەران بوون.

خوای بەبەزەییش هەموولایەکمان لەهەرکوێیەك بین، لە لادان و خلیسکان و هەڵدێران بپارێزێ و، لە عەیبداریی لای خەڵك و گوناهباریی لای خوا چەپاڵەمان بدات و، بەهۆی پابەندیی بەشەریعەتەکەیەوە سەربەرزو سەرفرازی دنیاو دواڕۆژمان بکات.

# دەستپێك

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله وصلى الله وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه

براو خوشكانی بەڕێز!

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته، زۆر خۆشحاڵم كە لەم ئێوارە كۆڕەدا لەشاری (لەندەن) بەدیدارتان شاد دەبم، ئەو بابەتەی كە من بۆم ئامادە كردوون (لەڕاستیدا هەوڵ دەدەم بەگوشراویی پێشكەشتانی بكەم) ناوونیشانەكەی بەم شێوەیەیە: (ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركەكانی)[1].

دیارە من لە سەردان و سەفەری یەكەمجارمدا بۆ ئێرە، بە پێویستمزانی ئەگەر نەشگونجێ بەدیداری هەموو براو خوشكانی كوردمان شادبین، بەلای كەمەوە ئاوا لە ئێوارە كۆڕێكدا بە دیداری ژمارەیەكی بەرچاوتان شادبین و هەڵوێست و بیروبۆچوونی خۆمانتان بۆ بخەینە ڕوو، سەبارەت بەوە كە ئەو خوشك و برا كوردانەمان كە لێرەن چ ئەركێكیان لەسەرشانە؟ من لە پێنج تەوەرەدا بۆتان باس دەكەم:

---

١) ناوونیشانی كۆڕەكە ئاوابوو: (ڕەوەندی كورد لە ئەوروپاو ئەركەكانی).

تەوەرەی یەکەم: ئەرکی سەرشانی براو خوشکانی کوردمان لێرە لەم وڵاتانی ڕۆژئاوا بەرانبەر بە خوای پەروەردگار، بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەرانبەر بە ئیسلام.

تەوەرەی دووەم: ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بەخاو و خێزان‌و خزم‌و دۆست‌و دەرو دراوسێ.

تەوەرەی سێیەم: ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بە یەکدی وەك (گەل)ێك، وەك نەتەوەیەکی هاوزمان‌و هاونیشتیمان.

تەوەرەی چوارەم: ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بە واقیعی ئێستای هەرێمی کوردستان‌و عێراق.

تەوەرەی پێنجەم: ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بەم خەڵك‌و کۆمەڵگاو بەم وڵاتەی لەژێر سایەیدا حەواونەتەوە.

# تەوەری یەکـەم

## ئەرکی سـەرشانی ڕەوەنـدی کـورد بەرانبـەر بە خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئیسـلام

ئەرکی سەرشانی هەر تـاکێکی کـورد کـە لێرە دەژی بـە خوشـك و براو بە گەنج و پیرەوە، بەرانبـەر بـە ئیمـان و ئیـسلام و عەقیدەکـەی، کـە بۆتـە پێکهێنـەری کەسایەتی و بۆتـە کلتـوورو فەرهـەنگی و بۆتـە مێژووی، چییە؟ ئەم بابەتەم کردوە بە سێ برگـە:

برگەی یەکەم: ئەرکی سەرشـانمان بەرانبەر بە خوا سبحانە وتعالـی.

برگـەی دووەم: ئـەرکی سەرشـانمان بەرانبـەر بـە پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم.

برگەی سێیەم: ئەرکی سەرشـانمان بەرانبـەر بـە ئیـسلام کـە بریتیـە لـەو بەرنامـەو ڕێبـازە کـە خـوای پـەروەردگار بـە پێغەمبـەردا ناردوویەتی.

بۆیـەش ئـەم تەوەرەیـەم کردۆتـە دەسـتپێك و بناغـەی بابەتەکـەم، چونکە لەڕاستیدا قەناعەتم وایە، نەك ئێمە وەك گەلـی کورد، بـەڵکو هەر گـەل و نەتەوەیەك، دینێك و قیـەمێکی بـەرزی ئاسمـانیی نـەبێ، کە ببێتە هەوێن و هەناوو سەرچاوەی ئیلهامی، بـۆ چۆنیەتی ژیـان و گوزەران و، بۆ چۆنیـەتی ڕێکخستنی کاروباری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی، ڕەنگە ئـەو گـەل و نەتەوەیـە هەنـدێك لـە قۆناغـەکانی ژیـانی بەسـەر

بەرێ، بەڵام بێگومان ئایینەدیەکی گەش و ڕوونی نابێ، خەڵکی ئەم وڵاتانەش ئەگەر تەماشای ڕواڵەتی ژیان و گوزەرانیان بکەین، ڕەنگە زۆرجار وابێتە بەرچاومان کە هیچ پەیوەندییان بە دینەوە نیەو پەیوەندییان بەشەریعەت و یاساو ڕێسای ئاسمانییەوە نیە، بەڵام ئەگەر مێژوو هەڵکۆڵین و تەماشای هەڵسوکەوتەکانیان بکەین، پاشان لەڕەگ و ڕیشە قووڵەکەی وردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە زۆر لەو ئاکارو بەها بەرزانەی کە خەڵکی ئەم وڵاتانە هەیانەو، بۆتە هۆی ئەوە کە شارستانییەتێکی ماددیی لەسەر بنیات بنێن، ڕەگ و ڕیشەکەی دەچێتەوە نێو ئەو تەعالیم و یاسا شەرعییانەی کە لەدینی خۆیاندا هەن، واتە: ئایینە ئاسمانییەکەی کە پێیەوە پابەندن لەگەڵ ئەوەشدا کە گۆڕدراوەو دەستکاریی زۆر کراوە، دیارە ئەوە باسێکی وردو درێژەو لێرەدا نامەوێ بچمە نێوی.

## ١- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە خوا عز وجل:

خوشك و برایانی بەڕێز !

ئەرکی سەرشانی ئێمەی مسوڵمان لێرەو لە هەر شوێنێکی دیکەش، ئەوەیە کە بەڕاستی هەمیشە هەوڵبدەین پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا پەیوەندییەکی تەڕو تازەو گەرم و گوڕو پتەو بێ، نەك پەیوەندییەکی ساردو سڕ ! چونکە ئینسان ئەگەر خوای نەناسی خۆی لێ ون دەبێ، بۆیە خوا جل شأنە ئینسانی بێ بڕوای بە وشەی (ضالّ) پێناسە کردوە، واتە: کەسێکی بزربوو، نەك ڕێی لێ ون بوو، بەڵکو خۆی لەڕێ ون و بزربووە، چونکە کاتێك ئینسان لەخوا دەپچڕێ، هەر نازانێ شوێن و جێگا (محلّ)ی لە ئیعڕابی بوونەوەردا

چییەو، نازانێ لە کوێوە هاتوەو، کێ هێناویەتیو، بۆچی هاتوەو، بۆ کوێ دەچێ؟!

وە لەڕاستیدا ئەوەی مانا بۆ ژیان پەیدا دەکات، بریتیە لە ئیمانو خواناسیی، کاتێك خاوەنی خۆتو خاوەنی ئەم بوونەوەرەت ناسی، ئنجا تێدەگەی کە ئەو خاوەنە چی لەتۆ ویستوەو بۆچی تۆی دروست کردوەو، چ ڕێیەکی بۆتۆ دیاری کردوەو، بۆ کوێت دەبات، جا بێگومانیش ئەگەر لە شەریعەتە شێوێنراوەکانی دیکەی خوادا وەك یەهودییەتو نەصرانییەتو ئەوانیدیکەش، خوای بەدیهێنەرو سیمای خواناسیی شێوێنراوە، ئەوە لەڕاستییدا لە ئیسلامدا کە تاکە بەرنامەی دەستکاریی نەکراوی خوایە، دەتوانین پەیوەندییەکی ڕاستو دروست لەگەڵ خوا ببەستینو، باش بیناسینو بەچاکترین شێوە بەندایەتیی بۆ بکەینو بیپەرستین، چونکە هەمووتان دەزانن کە تاکە کتێبێکی ئاسمانیی دەستکاریی نەکراو لەبەردەستدا مابێ، بەس قورئانە، ئەوەش نەك هەر ئێمە وەك مسوڵمان وا بڵێین، بەڵکو هەموو خاوەن ئینسافێك هەتا لەزانایانی جوولەکەو گاورو خەڵکی دیکەش دان بەو ڕاستییەدا دێنێ، کەتاکە کتێبێك بتوانین بڵێین ئەوە فەرمایشتی خوایەو دەستکاریی نەکراوە، تەنیا قورئانە، ئەوانی دیکە هەموویان گۆڕدراونو خراوەتە سەریانو لێشیان کەم کراوە، وەك خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ ...يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ... ﴿١٣﴾ ﴾ المائدە، واتە: وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەنو دەیانگۆڕن، وەبەشێکیان لەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون، لەبیرکرد.

هـــــــەروەها فەرموویـــــــەتی: ﴿ ...يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ... ﴾ ﴿٤١﴾ المائدة، کەواتـە: ئێمـە بناغەیـەکی بـاش‌و دروســتمان لەبەردەســتدایە کــە قورئانــە بــۆ ناســین‌و پەرســتن‌و بەندایەتی بۆ کردنی خوای پەروەردگارو پێوە پەیوەستبوونی.

ئنجا شتێکی بەڵگە نەویستە کە هیچ ئینسانێك لە ژیانـدا ناتوانـێ پەرسـتراو (معبـود)ێکـی نـەبێ، ناتوانـێ شـتێکی نـەبێ کـە لـەخۆی بـەرزتری تەماشـا بکات، جا جاری وایـە پەرسـتراوی حـەقی لـێ ون دەبـێ، کـە خـوای پـەروەردگارو بەدیهێنـەرەو شـتێکی دیکـە دەکاتـە پەرسـتراوی خـۆی، وەك: هـەواو ئـارەزووی خـۆی، ئینـسانێك، خـۆر، مانگ، حیزبێك، دارێك، بەردێك، بەڵکو جاری وایـە ژیانـدارێك، وەك زۆر لە هیندۆسـەکان‌و خـەڵکی نامـسوڵمانی ڕۆژهـەڵاتی ئاسیا مانگاو مـارو مـشك دەپەرسـتن، وەزۆر لـە ئەفریقییـەکان هەنـدێك جـۆرە درەخت‌و گژو گیا دەپەرستن، بەڵێ ئینسان بـەبێ پەرسـتراو (معبـود) ناتوانێ بژی، وە جاری وا هەیە کە پێی وایە هـیچ پەرسـتراوێك نیـە، دەچێ ئارەزووی خـۆی دەپەرسـتێ، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ... ﴾ ﴿٢٣﴾ الجاثيـــة، واتــە: ئایـا سـەرنجی ئـەو کەسە نادەی کە ئارەزووی خۆی لـێ بۆتە پەرستراو و دەیپەرستێ؟!

کەواتە ئێمە ئەرکمان بەرانبەر بـەخوای پـەروەردگار ئەوەیـە، کـە وەك تاکـە پەرسـتراو (معبـود) بیپەرسـتن لەسـەر بناغـەی ئـەو تاکـە کتێـب (قورئـان)ەی کـە دەسـتکاریی نـەکراوە، وەك خـوای تـاك‌و پـاك

فەرمووویەتی: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ...﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: خوا جگە لەو هیچ پەرستراوێك (ی بە هەق) نیە هەمیشە زیندووی سەرپەرشتیارە.

هەروەها فەرمووویەتی: ﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: وەپەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، جگە لەو هیچ پەرستراونین، بە بەزەیی بەخشندەیە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ غافر، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ رەخساندوون تاکو ئیسراحەتی تێدابکەن، وە رۆژگاری رووناك کردەوە (بۆ کاسبیی) بێگومان خوا خاوەن چاکەو بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاریی ناکەن، ئائەو خوایەتان پەروەردگارتانە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، تەنیاو ئەو بپەرستن وە ئەو سەرپەرشتیاری هەموو شتێکە.

ئنجا تەنیا پەرستنی خواو تەنیا بەندایەتی کردنیش بۆ خوا، بەوە دەبێ، کە خوا سبحانە وتعالی لەلامان لە هەموو کەس و هەموو شتێك گەورەو بەرزترو خۆشەویستتر بێ و، ئەو سام و شەرم و

شكۆیەی بەرانبەر بەو هەمانە بەرانبەر بە هیچكەس نەمانبیٚو، ئەو ملكەچییەی بۆ ئەو هەمانە بۆ هیچكەسی دیكە نەمانبیٚ.

واتە: ئەوپەڕی بە گەورەگرتن و خۆشویستن و لێترسان و ملكەچكردنمان بۆی هەبیٚ، كە دیارە ئەمەش بەبیٚ شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەی صلى الله علیه وسلم و پابەندیی بە كتێب و شەریعەتەكەیەوە مەیسەر نابیٚ.

## ٢- ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە پێغەمبەری كۆتایی صلى الله علیه وسلم:

بەداخەوە زۆرجار مسولمانان لە ئەنجامی بیٚئاگایی و دووركەوتنەوە لە دینەكەیانەوە، وادەزانن كە پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم هەر وەك پاپایەك، یاخود شێخێكی تەریقەت، یاخود كەسایەتییەكی ڕووحیی، ئەرك و پیشەی ئەوەبووە، كە ببێتە واسیتە لەنێوان خواو خەلكدا !

نەخێر وانیەو دەبیٚ بزانین، كە خوا بۆچی پێغەمبەری ڕەوانە كردوە؟ دیارە بۆیە هەلبژێردراوەو ڕەوانەی كردوە، تاكو ئێمە فێری جۆرە ژیانێك بكات كە جێگەی ڕەزامەندیی خوایە، هەر بۆیەش خوا لەنێو بەشەردا پێغەمبەرانی ڕەوانە كردووەو، كافرەكان هەمیشە ڕەخنەیان گرتووەو گوتوویانە: بۆچی خوا فریشتەیەك ناكات بە پێغەمبەر؟ خوا دەفەرمویٚ: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ

﴿... مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾﴾ الإسراء، واتە: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەكان بەئارامیی ڕۆیشتبان، ئێمەش پێغەمبەرێكی فریشتەمان بۆ دەناردن، بەڵام لەسەر زەوی ئینسانەكان دەژینو، دەبێ پێغەمبەریش هەر لە خۆیان پێبگەیەنێو، تێیان بگەیەنێ كە چۆن بژین؟ تا خوا لێیان ڕازی بێ، چونكە ئەم ژیانە دونیایە تاقیگەیە، ئەدی چۆن دەزانی كە دەبێ چۆن بژی تا خوا لێت ڕازی بێ؟ بێگومان بەهۆی پەیامی خواو سروش (وحي)وە، ئنجا ئایا كێ ئەو سروشو پەیامە خواییەت بۆ دێنێ؟ ئینسانێكی وەك خۆت، كە وەك تۆ خۆت خاوەنی هەستو نەستو خوێنو گۆشتە، وەك تووڕە دەبێو خۆشحاڵ دەبێ، پێویستی بە خواردنو خواردنەوەو خەوتنو پشوودانو كارو كەسابەت هەیە، تاكو وەك ئینسانێك ببێتە سەرقافڵەو پێشەنگ، خوا سبحانە وتعالی لەسەر زمانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ... ﴿١١٠﴾﴾ الكهف، واتە: تۆ بڵێ: من بەشەرێكم وەك خۆتان بەڵام پەیام (وحي)م بۆ دێ كە تەنیا خوا بپەرستن، واتە: جیاوازی من لەگەڵتان هەر ئەوەیە كە پەیامی خوام بۆ دێ، تاكو بە ئێوەی ڕابگەیەنم، ئەگەرنا منیش هەر ئینسانێكم وەك ئێوە.

جا زانینی ئەم مەسەلەیە شتێكی گرنگە، چونكە تەماشا دەكەین لە ئایینو شەریعەتەكانی دیكەی دەستكارییكراو و شێوێنراودا، زاناو پاپاكانیان خۆیان بردۆتە سەرووی ئاستی خەڵكو گوتوویانە: ئێمە شتێكین لە خەڵك جیاین، بۆ وێنە گوتوویانە: وەكیلو سێبەری خواین لەسەر زەوی ! بەڵام لە ئیسلامدا ئەوە نیە، تەنانەت

پێغەمبەریش بەشەرێکە وەك ئێمە، تەنیا جیاوازیی ئەوەیە کە خوا پەیامی بۆ ناردوەو لە شوێنکەوتووانو ئوممەتەکەیشی لە هەمووان زیاتر پابەندی شەریعەتی خواو، لە هەموان مسوڵمانترو بەندەی چاکتر بووە بۆی، ئێستاش هەرکەسێك خۆی پێ زاناو پێشەوایەکی مسوڵمان بێ، دەبێ تەنیا جیاوازیی ئەوە بێ کە لە مسوڵمانان مسوڵمانترو پابەندتر بێ بەشەریعەتی خواوە !

نەك لەوان قسەی زلترو لاف لێدان (إدعا)ی گەورەتری هەبێو خۆی بە وەکیلی خوا بزانێ لەسەر زەوی، لە ئیسلامدا چینی ئەکلیرۆس (طبقة الکهنوت) نیە، بەڵکو مسوڵمانان هەموویان لەلایەن خواوە دوێندراو (مخاطب)ن کاتێك، کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئەوە هەموویان دەدوێنێ وەك یەك بەبێ جیاوازیی.

هەموو ئیماندارێك مافی ئەوەی هەیە لە کتێبی خوا تێبگات، نەك وەك غەیری ئیسلام، کە تەنیا ئەو چینە تایبەتە بە مافی خۆیان دەزانن لە کتێبی خوا تێبگەن، بەڵام وەك گوتمان لە ئیسلامدا ئەوە مافی هەر تاکێکی مسوڵمانە، کە لە دینی خوا حاڵی بێو ڕاڤەو تەفسیری بکات، ئەوەندە هەیە زاناو پێشەوایان لە ئیسلامدا، ئەرکی سەرشانیان قورسترەو ڕێزیشیان لێگیراوە وەك ئەهلی عیلمو پسپۆڕ لەو باوەڕە، بەڵام ئیسلام لەسەر کەس تاپۆ نەکراوەو، ڕێگاش لە کەس نەگیراوە کە لە کتێبی خوا تێبگاتو ڕاڤەی بکات، وەك کە لە یەهودییەتو نەصرانییەتدا تەفسیرکردنی کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس) لەسەر دەستەیەك تاپۆ کراوە !

ئەرکیشمان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم ئەوەیە کە شوێن پێی هەڵبگرین و لە هەموو شتێکدا چاوی لێبکەین و، بە ڕێی ئەودا هەنگاو بنێنین بۆ دینداریی و دونیا دارییمان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ...﴿٢١﴾ ﴾الأحزاب، واتە: بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی جوان هەیە بۆ ئێوە.

## ٣- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە ئیسلام:

ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە شەریعەتی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە بزانین خوا ئەو شەریعەتەی هەڵبژادوە بۆ ئێمە، وەك ڕێبازو بەرنامەی ژیان، کە دەفەرموێ: ﴿ ...وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًاۚ ...﴿٣﴾ ﴾ المائدة، کەواتە هەرکەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و لە ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و...هتددا، بۆی نیە جگە لە ئیسلام و لەو شەریعەتەی، کە خوا بە (محمد) صلی الله علیە وسلم دا ناردوویەتی، شوێن هیچ شەریعەت و بەرنامەیەکی دیکە بکەوێ، ئەگەرنا بە مسوڵمان دانانرێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: وە هەرکەس جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێی وەرناگیرێ و لە دواڕۆژدا لە زیانبارانە.

جا ئەو ئایین بەرنامەیە هەرناو و نیشانێکی هەبێ‌و لە هەر کوێیەکەوە هاتبێ، چ لە ئەسڵدا ئاسمانیی بووبن‌و دوایی گۆڕابن‌و شێوێنرابن، وەك: جووایەتیی (یهودیة) و دیانەتیی (نصرانیة)، وە چ هەر لە ئەسڵدا زەمینیی بووبن، وەك سیکۆلاریزم‌و لیبڕالیزم‌و سۆسیالیزم‌و کاپیتالیزم.

# تــەوەرەی دووەم

## ئەرکی سـەرشا نمان بەرانبەر بە خـاوو خێزان و خزم و دۆسـت و دەرو دراوسـێ

ئەرکی سەرشانی ئێوەی بـەڕێز وەك ڕەوەنـدی کـورد بەرانبـەر بـە خاو و خێزان و خزم و دۆست و دەرو دراوسێ، پێویستە بزانین ئـەرکی سەرشانمان چیە بەرانبەر بەخاو و خێزان وەك هاوسەر، باب و دایـك، کـوڕو کـچەکانمان، خوشـك و بـرا، ئینجا خـزم و دۆسـت و ئاشـناو دەرو دراوسێ، براو خوشکانی بەڕێز!

ئێمــە زۆرجــار وا دەزانــین کــە مــسولمانێتی شــتێکی تــەنیا شەخـسیی و ڕووحییـە کـە بۆخـۆت ئـەنجامی دەدەی و پەیوەنـدی بـە کەسی دیکەوە نیە، بەلام لە ڕاستیدا ئـەوە تێگەیـشتنێکی زۆر کـرچ و کـاڵ و نابەجێیـە، بەلکو لەڕاستیدا لە ئیسلامدا وەك چۆن مـسولمان وەك تاکێـك لـەخودی خۆیـدا بەرپرسـیارەو ئـەرکی لەسـەر شـانە، بەرانبـەر بـە خـواو بـەو خـەلك و کۆمەلگـایە، کـە لەگەلیانـدا دەژی و هەلسوکەوت و مامەلەی لەگەلیاندا هەیە، بەلام بەشـێوەی بازنـە، بـۆ وێنە: بازنەی یەکـەم: ئەندامانی خێزانەکـەت، بازنـەی دووەم: خـزم و نزیکانـت، بازنــەی ســێیەم: دەرو دراوســێ و دۆســت و ئاشــنایانت، وە هــەروەها تــا هــەموو خەلــکی ســەر زەوی دەگرێتــەوە، مــسولمان بەرانبـەر بـە هـەموو مرۆڤایـەتی بەرپرسـیارە، بـەلام هـەتا بازنەکـە تەسکتــربێ، ئینــسان بەرانبــەری بەرپرســیارترەو، تــا بازنەکــە

بەرفراوانتــربێ، بەرپرســیارێتییەکەی کەمتــر دەبێتــەوە، هەڵبــەتە من چەند ڕۆژێکە هاتووم بۆ ئێرە، بەڵام وەك کوردەواریی خۆمـان دەڵێین: پێشتـریش لە پاش باسك نەبووم، هەندێك خەڵکمان کە لێرە لە ئەورووپا هەبووە پرسیارم لێکردوون، ئاگادارم کە چەندین خێزانـی کوردمـان لێـرە گرفـتو کێـشەی گـەورەیان بـۆ ساز بـووەو عەیبـەیان هاتۆتـە سـەر، لـە ڕێـی کـوڕو کـچەکانیانەوە، یـان لـە ڕێـی هـاوسـەرانیانەوە !

بەڵـێ ئێمە وەك ڕەوەندی کوردی کە لـێرەین، هەمووومان بەرانبەر بـە یەکـدی بەرپرسـیارین، بـەڵام پێویـستە ئینـسان بەرانبـەر بـەو بازنە تەسکەی کە بریتیە لە خێزان، هەست بـە بەرپرسیارێتیــیەکی باشتــرو زیـاتر بکـاتو بزانــێ، کـە مـاڵو خێزانـی ئـەرکیان لەسـەر شانیەتی، وە ئێمە بەرانبەر بە خێزانو هاوسـەرو کوڕو کـچەکانمان، تـەنیا ئـەرکی ئەوەمـان ناکەوێتـە سەرشـان، کـە چییان بـۆ پەیـدا بکـەین !

بەڵکــو لـــەپێش ئـــەوەدا ئـــەركو بەرپرســـیارێتی ئـــەوەمان لەسـەرشانە، کە ئاگامان لە ئیمانو ڕەوشتو هەڵسوکەوتیان بـێ، جـا کـەڵكو سـوودی چـییە تـۆ گـەدەی خـــاو و خێزانـت تێـر بکـەیو گیــرفانی پڕبکــەی، بــەڵام دوایــی بــەجۆرێك بـژی کــە خوانــەکردە تووشــی هەڵخلیــسکانو لادان (إنحــراف) ببـــێو خـــۆیو دونیــاو قیامەتیشی لەدەست بچـێو، تـۆش شـەرمەزارو عەیبـداری لای خـواو خەڵـك بکـا؟!

بەڕاستی ئەوە زۆر گرنگـەو بەرپرسیارێتییـەکی دینـیو دونیـاییو قیامەتییـەو، بەرپرسیارێتییـەکی شـەرعییو نەتەوەییشـە، ئێمـە کـە

لێرە (لە هەندەران) دەژین، نابێ لەنێو فیکرو فەرهەنگو دابو نەریتو کلتووری ئێرەدا بتوێینەوەو هەڵبوەشێین، کە دیارە ئەمەش بەوە دەگرێ هەرکەسەمان بەرانبەر بە خاو و خێزانی خۆی بە بەرپرسیار بزانێ، خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ...﴿٦﴾ ﴾ التحريم، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتانو خاو و خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن، کە سوتەمەنییەکەی بەردو ئیسانە.

ئینسان بەهۆی چییەوە توشی ئاگری دۆزخو سووتان دەبێ ؟ بێگومان بەهۆی لادانو تاوانو خراپەوە، کەواتە دەبێ ئاگات لێیان بێ، نەك بەو مانایە کە هاوسەرەکەت، یان منداڵەکەت کۆتو زنجیر بکەیو لە ماڵەوە زیندانی بکەی !، نا بەڵکو ئاگاداری بەو تێی بگەیەنەو فێری دینداریی بکەو بە پەروەردەیەکی چاكو جوان لەسەر خۆشویستنی خواو پێغەمبەرو بەرنامەکەیانو ڕەوشتو بەها بەرزەکان ڕایبهێنە، نەك بە زەختو زۆر، چونکە دینداریی شتێکی خۆکردی (طوعّي)و ئازادانە (إختياريّ)یە، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: تۆبزیی کردن لە وەرگرتنی دیندا نیە، چونکە ڕێی ڕاستو چەوت لێك جیابوونەتەوە، وە هەرکەسێك وا حاڵی بووبێ کە دەبێ هاوسەرو منداڵەکانی خزمو نزیكو دۆستانی بە زۆر پابەند بکات بە دینەوە، ئەوە لە بنەڕەتدا لە دین

تێنەگەیشتوە، چونكە دینداریی دەبێ هەركەسە بە ئارەزووی خۆی بیكاتو، لە قەناعەتو دەروونی خۆیەوە بێو، تەنیا ئەوە پاڵنەرو هاندەری بێ، كە خوا لێی ڕازی بێ بیخاتە بەهەشتەوەو لە دۆزەخ چەپاڵەی بدات !

توێژەرەوانی قورئان (مفسرين) بوێنە: (ابن كثير و طبري) دەڵێن:[1] هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ... ﴾ ئەوەبوو كە لەنێو عەرەبەكاندا وا باوبوو ئەگەر ئافرەتێك نەزۆك بووایەو منداڵی نەبووایە لەسەر خۆی نەزر دەكرد، كە ئەگەر خوا منداڵێكی پێ بدات، دەیكات بە یەهوودییو نەصڕانیی (چونكە خۆیان بت پەرست بوونو پێیان وابوو، كە یەهوودییو نەصڕانیی كتێبێكی خوایان لایەو دینێكی ئاسمانییان هەیە) جا دوای ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕەوانە كراو كۆچی كرد بۆ مەدینەو خەڵكەكە مسوڵمان بوو، ئەو كەسانەی منداڵەكانیان بوو بوون بە یەهوودیی، یان نەصڕانیی، ویستیان بەزۆر بیانهێنەوەو مسوڵمانیان بكەن، ئەوەبوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي

---

١) (عن ابن عباس قال: كانت المرأة تكون مقلاة فتجعل على نفسها إن عاش لها ولد أن تُهوّده، فلما أُجليتْ بنوا النضير، كان فيهم من أبناء الأنصار، فقالوا: لاندعُ أبنائنا، فأنزل عزوجل: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ...(٢٥٦) ﴾ البقرة)، رواه أبو داود والنسائي، بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج: (٥)، ص: (٤٠٧)، وە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص: (١٨٦،١٨٥).

ٱلدِّينِ ...﴿٢٥٦﴾ البقرة، واتە: تازە ئەو کە بۆتە یەهوودیی، یان نەصرانیی، دروست نیە بە زۆرەملێ بهێنرێتەوە نێو ئیسلام، بەڵێ مرۆڤ هەتا منداڵو نابالغە ئەرك و بەرپرسیارێتیو ڕێنماییکردن و پەروەردەکردنی لە ئەستۆی باب و دایکیەتی، بەلام کە بالغ دەبێ، تازە بۆخۆی بەرپرسیارەو تۆ مافی زەخت و زۆرت بەسەریەوە نیە.

جا دەبێ ئێمە لە قۆناغی بچووکییدا خەم و مشوور لە منداڵەکانمان بخۆین، تا بە گەورەیی لەبەریان بحەسێینەوە، بەڕاستی زۆرم پێناخۆشەو لەسەر سومعەی میللەتەکەشمان دەکەوێ، کە هەندێك ڕووداوی سەیرو سەمەرە دەبیسترێن، بۆ وێنە: فلان کەس هاوسەرەکەی لێی جیابۆتەوە، یان ڕەگەڵ کەسێکی دیکە کەوتوە، فلان کەس کچی ڕۆیشتوە، فلان کەس خوشکی ڕۆیشتوە، یان کوڕەکەی تووشی لادان و بەدڕەوشتیی بووە...هتد، بێگومان ئێمە وەك گەلی کورد خێرو شەڕمان بۆ یەکدی دەگەڕێتەوە، نابێ تێڕوانینمان وابێ بڵێین: ئێمە (ئیسلامیی)ین، بەلام ئەوانەی کوڕو کچ و هاوسەرو خوشك و برایان تووشی لادان و داڕووخانی ڕەوشت بووە، فلان و فیسار حیزب و لایەنن ! نەخێر وانیە، چونکە گەل و نەتەوەکانی دیکە، وەك یەك میللەت حیسابمان بۆ دەکەن و بۆمان دەڕوانن، وەك گوتم ئێمەی کورد خێرو شەڕمان بۆ یەکدی دەگەڕێتەوە، لە ڕۆژگاری شەڕی براکوژییدا من جارێك لە یەکێك لە وڵاتە عەرەبییەکان لە ئێوارە کۆڕێکدا پرسیاریان لێکردم گوتیان: ئێوە بۆچی هەمیشە شەڕتانەو سەرگەرمی یەکدی کوشتنن ؟

گوتـم: چـۆن ؟

گوتیان: تائێسـتا دەتـانگوت: حیزبـی بـەعس دەمانـچەوسێنێتەوە، خۆ ئێسـتا سێبەری حیزبی بەعسـتان لەسەر نەماوە، بۆچی یەکدی دەکـوژن؟

منیش گـوتم: خـۆ ئێمـە نـین وەك ئیـسلامیی، بـەڵکو ئـەو شـەڕی نێـوان (پارتیو یەکێتی)یە.

کابرای پرسـیارکەر گوتی: من ئەوە نازانم، بەڵکو ئەوەنـدە دەزانم کە میللـەتی کورد پێکـەوە بەشـەڕدێنو یەکدی دەکـوژن !

بێگومـان ڕاسـتیش دەکـات، خـۆ خـەڵك ئـەوە هـەموو زانیـارییو وردەکــارییەی نیـە، ئەوەنــدە دەزانــێ، کـە ئــەوە نەتــەوەی کـوردەو پێکەوە یەکـدی کـوژیی دەکات !

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە دەبێ زۆر بەتەنگ سومعەی یەکـدیو سەرجەم نەتەوەکەمانەوە بین، چونکە ئەوە کاریگـەریی خـۆی دەبـێ، واتە بۆ وێنــە: حاشــای ئێوەی بەڕێز خوشكو برایان! ئەگەر چەند جارێك خەڵکی کـورد دزیی کرد، ناپاکیی کـرد، بەپێچەوانەی یاسـای ئـەم وڵاتانـەوە جـووڵایەوە، ئـەوە بێگــومان بەرانبـەر هەموو گەلـی کورد بـێ متمانـە دەبـن، یـان ئەگــەر خـەڵکی عێراقی کـاری خراپـی کرد، لە هەموو خەڵکی عێراق بێ متمانە دەبن، کەواتـە ئـەو کەسـەی لادەداتو خراپـەو تـاوان دەکـات، لـەم وڵاتانـە، ئـەوە بـا مـسوڵمانیش نـەبێو هـەر شـــتێکی دیکـە بـێ، گـرنگ ئەوەیـە زەرەر لـە نـــاو و سـومعەی هەموو لایەكو هەموو کوردو خەڵکی عێراقیش دەدات !

بەهـەر حـاڵ ئێمـە ئـەرکێکی قورسـمان لەسەرشـانە بەرانبـەر بـە

ماڵو خێزانمان، لەکاتێکدا لە وڵاتێکی ئاوا نیشتەجێ دەبین، دەبێ ئاگامان لێیان بێ لە هەموو ڕوویێکەوە، ئێمە میللەتێکی مسوڵمانین، ئەدەبو کلتوورو فەرهەنگی سەربەخۆی خۆمانمان هەیە، کە لە دینەکەمانەوە سەرچاوەی گرتووە، دەبێ ئاگامان لێبێو منداڵەکانمان لەسەر ئەوە پەروەردە بکەین، بە پەروەردەیەکی ڕاستو دروست، نەك پەروەردەیەکی نەزانانە کە دینی ئیسلام ناشیرین بکەین، دەبێ هەوڵبدەین خوایان پێ بناسێنین، پێغەمبەریان پێ بناسێنین، بە جوانی ئیسلامیان تێبگەیەنین، ئەو ئیسلامەی، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ...(٣٠) ﴾ الروم، واتە: ڕووی دڵت بەرانبەر بە دینی خوا ڕاست ڕابگرە، ئەو فیتڕەتو سروشتەی، کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندووە، دینی خوا ڕێك بە پێی سروشتی ئینسانە، شەریعەتو فیتڕەت دوو ڕووی یەك سکەن، هەرچی شەریعەت فەرموویەتی، سرووشتو فیتڕەتی ساغی ئینسانیش هەر ئەوەی دەوێ.

# تەوەرەی سێیەم

## ئەركی سەرشانی ڕەوەندی كورد بەرانبەر بە یەكدی

براو خوشكانی بەڕێز!

ئینسانەكان لە هەموو شوێنێك بەرانبەر بە یەكدی بەرپرسیارن، بەلام دیارە لێرە لە وڵاتی غەریبایەتی بەرپرسیارێتییەكە زیاتر دەبێ، بۆچی؟ چونكە ئینسان لەكاتی لێقەومان و تەنیایی و غەریبایەتیدا، بێگومان زیاتر پێویستی بە هاوكاریی و دەستبار بۆ یەكگرتن هەیە، بۆیە بەرانبەر یەك زیاتر بەرپرسیار دەبین، ئەوەش لە چەند ڕوویەكەوە:

جارێ ئێمە ئەوانەی خۆمان بە مسوڵمان و ئیماندار دەزانین، وەك برایەتی ئیمانیی بەرانبەر بە یەك بەرپرسیارین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات، واتە: بێگومان ئیمانداران براو خوشكی ڕاستەقینەی یەكدین، هەڵبەتە وشەی (إِخْوَان) جیایە لە وشەی (إِخْوَة) كە هەردووكیان لە قورئاندا بەكارهاتوون، چونكە (إِخْوَةٌ) پیاوان و ئافرەتان دەگرێتەوە، واتە: تەنیا بڕواداران براو خوشكی ڕاستەقینەی یەكدین، پیاوان برای یەكدین و ئافرەتان خوشكی یەكدین و، پیاوان و ئافرەتانیش براو خوشكی یەكدین.

جا ئایا برایەتیی و خوشکایەتیی لەگەڵ یەکدیدا هەروا قسەیەکەو دەگوترێ و هیچی دی؟

نەخێر، هەم لە قورئانیشیداو هەم لە سوننەتی پێغەمبەریشدا صلی الله علیه وسلم ڕوون کراوەتەو تیشکی خراوەتە سەر کە حەق و مافی ئێمە لەسەر یەکدی چییە؟ بۆ وێنە: لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: {حق المسلم على المسلم خمس: رد السلام، وعيادة المريض، واتباع الجنائز، وإجابة الدعوة وتشميت العاطس} . متفق علیه.

واتە: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان پێنج شتە، وەڵامدانەوەی سەلام، وە سەردانی نەخۆش، وە شوێنکەوتنی تەرمان، وە وەڵامدانەوەی بانگهێشتکران، وە گوتنی (یرحمك الله) بۆ بابای پژمیو.

واتە: لە سەلام لێکردن، تا ناشتن و بەخاك سپاردن، مسوڵمانان حەقیان بەسەر یەکەوە هەیە !

ئەوە لەسەر بناغەی برایەتی ئیمانیی، هەروەها لەسەر بناغەی برایەتی ئینسانییش خۆ ئێمە هەر براین، چونکە ئەگەر لە ئیمانداریی‌دا پێك نەگەینەوە، ئەوە لە ئەسڵی یەك خێزانیی و لە ئەسڵی ڕەچەڵەك و نەژاددا هەر پێکدەگەینەوە، وەك خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات، واتە: ئەی خەڵکینە! (بانگی تێکڕای

ئادەمیزادەکان دەکات نەك تەنیا نەتەوەیەك) ئێوەمان لە نێرو مێیەك (ئادەم‌و حەووا) دروست کردوە، دوایی گێڕاومانن بە چەند گەل‌و تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسن {پێکەوە ئاشنابن‌و هاوکار بن‌و دەستبار بۆ یەکدی بگرن، سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوەو دادگەریی (عدل) بچەسپێنن} بەڕێزترینتان لای خوا، ئەوەتانە کە لە هەمووتان پارێزکارترە.

واتە: با کەس خۆی بە ڕەنگی، ڕەچەڵەکی، زمانی، ماڵ‌و سامانی، هەڵنەکێشێ، کێ زیاتر پابەند بێ بە شەریعەتی خواوە، ئەوە لەلای خوا نزیکترەو قەدرو ڕێزی زیاترە.

ئنجا کە سەرنجی قورئانیش بدەین دەبینین، کە هەر پێغەمبەرێك پەیامی خوای بۆ هاتوەو چووە بۆ لای گەل‌و نەتەوەکەی، فەرموویەتی: ﴿ ...يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ...﴿٦٥﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بێجگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ ...﴿٦٥﴾ ﴾ الأعراف، وە: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ ...﴿٧٣﴾ ﴾ الأعراف، وە: ﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ ...﴿٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

لێرەدا (أَخَاهُمۡ) واتە: برایەکەیان لە ڕەچەڵەك‌و نەژاددا، برایان لە نەتەوە، لە تیرەو هۆز، لەوەدا کە پێکەوە لە وڵاتێکدان‌و هاووڵاتیین، کەواتە ئەوەش حەق‌و ماف لەسەر یەکدی پێویست دەکات‌و پێویستە بە چاکی ڕەچاو بکرێ.

ئینجا بـە بۆچـوونی مـن گرنگتـرین بناغـە بـۆ ئـەوەی ئـەرکی سـەرشانمان بەرانبـەر بەیەکـدی جێبـەجێ بکـەین و پەیوەنـدیمان پێکـەوە بـەهێزو پتـەوبێ، ئەوەیـە کـە ئێمـە خاڵـە هاوبەشـەکانی نێوانمان بکەینـە بنـاغەو پێوەرو لـە خاڵە جیاوازەکانـدا چاوپۆشـیی لە یەکـدی بکـەین، بـۆ وێنـە: ئێمـە خـاڵی هاوبەشـمان زۆرن، نـەك هـەر وەك گـەلی کـورد بەڵـکو وەك تێکڕای مرۆڤایـەتی، بـەڵام ئێمـە باسی خۆمان دەکەین وەك گەلی کـورد.

١ – ئێمـە هـەمووومان گەلـێکی ستەمدیدەین، نەتـەوەی کـورد تاکـە نەتەوەیەکـە دەوری (٤٠) ملـیۆن بـێ، بـەڵام تـا ئێـستا لەسـەر نەخشـەی سیاسیی بوونی نـەبێ، بەڕاستی ئـەوە زوڵمێکـە لـێمان کـراوەو حەقێکـە لێمـان زەوت کراوە، کە خوای دادگـەر بـە هـەموو گەل و نەتەوەیەکی داوە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ... (١٣) ﴾ الحجـرات، واتـە: وە گێڕاومـانن بەچـەند گـەل و تیـرەك، وەك چۆن عـەرەبی کردوە بە گەل، هەرکام فارس و تورك و ئینگـلیزی کـردوە بـە گـەل، ئێمەشـی کـردوە بـە گـەل، ئـەوەتا زمـان و خـاك و وڵاتمـان هەیـە، ئەدی بۆچی قـەوارەی سیاسـییمان نیـە ؟

بێگومـان ئـەوە زولـمێکـە لێمـان کـراوەو کـاتی خـۆی لـە سـاڵی (١٩١٦)ز دا وڵاتـی زلهـێزی وەك: بـەریتانیاو فەڕەنـساو ڕووسـیا، (سایکـس پیکـۆ)یـان مـۆرکردوەو کوردستـانیان کـردوە بـە چـەند بەشـێك و هـەر بەشـەیان لکانـدوە بـە دەوڵەتێکـەوە، کەواتـە: ئـەم واقیعـەی ئێسـتای ئێمە، ئەو دەوڵەتانە بوون، کە هێنـاویانەتە دی،

هەرچەندە بەداخەوە ئێستا هەندێك كەسی سادە لە عەلمانییەكان زۆریان ستایش دەكەن و پێیان هەڵدەڵێن !

**جا** ئا ئەوە، منێكی ئیسلامیی و، ئەوەی دیكەی عەلمانیی و، ئەوی دیكەی هەر بیروڕایەكی دیكەی هەبێ، هەمووومان پێویستمان بەوە هەیە كە قەوارەو سایەوە سێبەرو چوارچێوەیەكمان هەبێ، كە لەنێویدا بۆخۆمان بژین و كەس نەبێ خۆیمان لەسەر بكاتە ملۆزم و بمانچەوسێنێتەوە، یان بمانكاتە هاووڵاتی پلە دوو و پلە سێ، وەك كە ڕژێمی بەعس دەیكرد ! دیارە ئەوە خاڵێكی هاوبەشی هەموو لایەكمانە.

٢- پاشان ئاوەدانكردنەوەی وڵات و دروستكردنەوەی ژێرخانی ئابووریی و بەرەوپێشبردنی پیشەسازیی و كەرتی كشتوكاڵیی و بازرگانیی و ئاژەڵداریی، تاكو خەڵك لە خۆشگوزەرانییدا بژی، چونكە خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەتدا مرۆڤایەتی دواندووەو فەرمانی پێكردوە كە: ڕزق و ڕۆزی خوا داوا بكەن و بە زەویدا بڕۆن، بۆ كەسابەت و بەهرەمەند بوون لە بەخششەكانی خوا وەك فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ...﴿١٠﴾ ﴾ الجمعة، ئەوەش خاڵێكی دیكەی هاوبەشە.

٣- هەروەها دادگەریی، خاڵێكی دیكەی هاوبەشمانە، چونكە زوڵم بناغەی پەرتەوازەییەو دادگەریی بناغەی برایەتیی و تەبایی و پێكەوە ژیانە، هەر كۆمەڵگاو میللەتێك دادگەریی لەنێودا هەبوو، پێكەوە گونجاوو تەبا دەبێ، وە بە پێچەوانەوە هەر

کۆمەلگــاو میللەتێك زاڵمو مـەزلوومی تێدا هـەبوو، چەوسێنەرو چەوســـاوەی تێــدا هـــەبوو، حەتمـــەن ئـــەو کۆمەلگـــایە لێــك هەڵدەوەشێو لەنێو خۆیدا گەندەڵ دەبێ، لە سۆنگەی ئـەوەوە کـە قڕیـیو پڕیـیو چـینایەتی تێـدا سـەرهەڵدەداتو سـەرەنجام ئـەو کۆمـــەلگاو میللەتـــە ســـەری بەفـــەتارەت دەچـــێ، وەك خـــوا فەرموویـــــەتی: ﴿ ... وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص، ئـەوەش خـاڵی هاوبەشـەو دەیـفەرموو با لە خۆمانەوە دەسـت پێبکەینو دادگەریی بچەسپێنین.

٤- چەسـپاندنی ئـازادیی، بەهـەمان شـێوە خـاڵی هاوبەشـە، خـوای پەروەردگـار هەموو ئینسانێکی ئازاد خوڵقاندوە، وە خوای دادگـەر بۆیە (لا الـة إلا الله)ی کـردوە بـە بناغـەی بەرنامەکـەی، بۆئـەوەی هیـچ کـەس خۆی لەسەر کەسـی دیکـە نەکـاتە پەرسـتـراو (إلـه)، (لا الـه الا الله) واتـە: بێجگـە لـە خـوا هـیچ پەرسـتـراوێکی دیکـە نیە، کەواتە کەس بۆی نیە بـەهیچ ناوونیـشـان (عنـوان)ێـك خـۆی بەسەر خەڵکدا فەرز بکاتو، ئاغایـەتییو کوێخـایەتییان بەسـەردا بکاتو خەڵك بە خزمەتکـارو نۆکـەر بزانـێ ! نـەخێر، هـیچ کـەس بـۆی نیـە پەرسـتـراو (إلـه) بـێ، جگـە لـە خـوا، بەڵـێ ئێمـە خـاڵی هاوبەشـــمان زۆرن، ئەگـەر خاڵـە هاوبەشـەکانمان بکەینـە بناغـەی پەیوەندییەکـــانمان، ئەوکـــاتە زۆر هەسـت بـە نیزیکـیی دەکـەین، ئێمە لە خەباتی ڕزگاریخوازییماندا خـوای پەروەردگـار بەرەکـەتی زۆری خـــستە ئیـــشوکارمانەوە، بەتایبـــەت لـــە ڕاپەرینـــە جەماوەرییـەکەی سـاڵی (١٩٩١)دا، چونکـە بە تەباییو یەك دەسـتـی

دەستماندایە، ئەوەبوو هەموو لایەنەکان بە عەلمانیی‌و ئیسلامیی‌و، تەنانەت ئەوانەش کە دوایی ناومان لێنان (چەکدارە شۆڕشگێڕەکان) کە تا ئەو کاتە لەگەڵ ڕژێم بوون، یەك دەست دەستمان دایەو خوای بەرزو مەزنیش شتەکەی بەدەستەوە هێنایین.

هەروەها ئێستاش کە لە خوا بەزیادبێ، تا ئەندازەیەك تەبایی هەیە، تەماشا دەکەین هێزو پێزمان هەیە، وە بە ئەندازەی ئەوە، کە کاتی خۆی پێکەوە ناڕێك بووین، درزیش لە ڕێزەکانمان بووەو دوژمن لە درزەکانی خۆمانەوە هاتۆتە نێومان، دوژمن بەهۆی ناتەبایی خۆمان زەفەری پێ بردووین، نەك بەهۆی ئازایەتی خۆیەوە، هۆکارەکە خۆمان بووین، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الشورى، واتە: هەربەڵایەکتان تووش بێ، ئەوە بەهۆی کردەی دەستی خۆتانەوەیە، بەڵێ بەڕاستی خوشك‌و برا بەڕێزەکانم!

ئێوەی لێرە وەك ڕەوەندی کورد بەرانبەر بەیەکدی زۆر ئەرکی گەورەتان لەسەر شانە، من ناتوانم حوکم بەسەر ئێوەدا بدەم‌و گومانی خراپتان پێ‌بەرم، بەڵام دیارە کەم‌و زۆر ڕەوەندی ئێرەش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی واقیعی هەرێمی کوردستان، کە بەداخەوە لەوێ هەستی حیزبایەتیی زاڵە، لەوێ ئەوەندەی کابرا هەست دەکات بە ئینتیمای سیاسیی‌و حیزبیی خۆی، ئەوەندە هەست ناکات بە ئینتمایی نەتەوەیی‌و نیشتمانی خۆی، کە بەڕاستی ئەوە زۆر

زەرەری لێداوین، هەڵبەتە سوپاس بۆ خوا ئێستا لە کوردستان هەنگاوی باش نراون‌و، ئومێدەوارین ئەو هەنگاوانە بچەسپێن، وەك یەکگرتنەوەی دوو ئیدارەکان‌و وەگەڕخستنی پەرلەمان‌و شتی دیکەش، وە (إن شاء الله) هەنگاوی باشتریش دەنێین، ئێوەش لێرە لەسەرتان پێویستە لە سەرووی ئاستی حیزبایەتییەوە خۆتان ببینن، حەقی ئەوەتان نەبێ بڵێن: ئەوە کۆمەڵی ئیسلامییە، ئەوە یەکگرتوویە، ئەوە پارتییە، ئەوە یەکێتییە، ئەوە سۆشیالیست‌و ئەوە شیوعی‌و ئەوە فلان حیزب‌و لایەنەیە !

پێش ئەو شتانە دەبێ تۆ هەست بکەی، کە تۆ کوردێکی مەزڵوومی لەم وڵاتە، هەمووتان پێویستتان بەهاوکاریی یەکدی هەیە، ئینسان لەم وڵاتە غەریبایەتییە تەنانەت پێویستی بە سەلامێك‌و بە دڵخۆشکردنێکی یەکدیش هەیە.

ئینجا بەڕاستی ئەگەر وەك گوتم ئاوا بە فراوانی باوەش بۆ یەکدی بکەینەوە، ئێمە زۆرین‌و دەتوانین گرفت‌و کێشەی زۆر گەورەی یەکدی چارەسەر بکەین، بەڵام هەرکەسە بەدەردی خۆیەوە بتلێتەوەو، هەرکەسە لە قاڵبی خۆیدا خۆی کورت هەڵبێ‌و کەس سەلام لە کەس نەکات، یان ئینتیمای حیزبیی‌و سیاسیی زاڵ بکەین بەسەر ئینتیمای نیشتمانیی‌و نەتەوەییدا، ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەوکاتە پەرتەوازەو دابڕدابڕ دەبین‌و، هەموو لایەکیشمان زەرەر دەکەین.

# تــەوەرەی چــوارەم

## ئەركی سـەرشانی ڕەوەندی كورد بەرانبــەر بە واقیـعی ئێسـتای هەرێمی كوردسـتانو عێراق

بێگومان ئێمە[1] كە لێرەین دەبـێ ئـەو ڕاسـتییە بـزانـین، كـە وەك میـوانو بـە شـێوەیەكی كـاتیی لێـرەین، هـەركامێك لـە ئێـوە بگـرین بەڵگەو پاساوێكی بەدەستەوەیە كە سەری خۆی هەڵگرتووەو هاتوە بۆ ئێـرە، وەك پاسـاوی ئـەمنیی، سـیاسیی، ئـابووریی، كۆمەڵایـەتیی، زانـستیی، تەنـدروستیی..هتـد، گـرنگ ئەوەیـە هۆیـەك هەیـە، بـەڵام دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین كە شوێنی دانیشتنی ئێمە كوردستانەكەی خۆمانـە، نـەك ئێـرە، جـا ئەگـەر خەڵـك هـەمووی وەك ئێـوە بكـات، دەبێ هـەموویان بێنو كوردستان چۆڵ بكـەن، بەڵـێ ڕەنگـە زۆربـەی خوشكو برایانی ئێرەمان ئەو پاساوانەیان هەبێ كـە باسـمان كـردن، بـەڵام بەڕاسـتی مـن بەلامـەوە گرنگـە، كـە بـراو خوشـكانمان ئـەم حـاڵەتە وەك حاڵـەتێكی هـەڵاوێرراو (إسـتثنائي) و ڕێزپـەر (شـاژ) تەماشا بكەن، نـەك وەك حاڵـەتێكی ئاسـایی!، نـەخێر لـێرە بوونمـان ئاسـایی نیـە، حاڵـەتی ئاسـاییمان ئەوەیـە لـە وڵاتـی خۆمـانو لـەنێو نەتەوەو لەسەر خاكو ئاوی خۆمان بینو بژین، بەڵام ئایا دەبـێ ئـەو حاڵەتــە نائاســاییەی ئێــرە وامــان لــێ بكــات كــە هەســت بــە بەرپرسـیارێتی نەكەین بەرانبەر بە كۆمەڵگاو نیشـتمانی خۆمـان ؟

---

٣) لێرەدا بەناوی كەسێك لە كوردانی ڕەوەند قسەم كردوە.

بێگومان نەخێر، بەڵکو ئێمە بەرپرسیارین بەرانبەر بە واقیعی ئێستای کوردستان، لە چەند ڕوێکەوە:

یەکەم: لەگەڵ ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی کوردستانو عێراقدا بژینو کارلێك (تفاعل)یان لەگەڵ بکەین، کە ڕەنگە هی وا هەبێ لەبەر کرێکارییو ئیشو کاری خۆی، هەر لەبەر ئەوەی چوار پاوەند زیاتر پەیدا دەکات هەرگیز گوێ نەداتە عێراقو کوردستان، داخۆ چییان لێهات، ئاو بردنی ئاگر سووتاندنی؟! بەڕاستی ئەوە چ وەك دین تەماشای بکەین، کەمتەرخەمییەکی گەورەیە، وە چ وەك لایەنی نەتەوەیی تەماشای بکەین، هەر کەمتەرخەمییەکی گەورەیە، بۆیە ئینسان نابێ لەو واقیعەی ئێستا لە عێراقو کوردستاندا دەگوزەرێ دابڕێ چونکە، هەمووومان لەبەرانبەریدا بەرپرسیارین، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته)، رواه مسلم، واتە: هەرکام لە ئێوە بەپرسیارەو چاودێرە بەرانبەر بە خەڵكو کۆمەڵگای خۆی، جا بە ئامۆژگارییەکی چاك بێ، بە دووعایەکی خێر، بە سەرنجو تێبینیو ڕەخنەگرتنێکی بەجێ، بەنووسینێك، بە هاوکارییەکی ماددیی، مەعنەویی..هتد، گرنگ ئەوەیە هەموو ئەوانەی کە لێرەن بەرپرسیارن بەرانبەر بەو واقیعەی کە لەوێ لە ئارادایە، بێگومان پێویستیشی بە هاوکاریی ئێوە زۆرە، ئێوە لێرە دەژین زۆر شتی ئیجابی لەم واقیعەی ئێرەو کۆمەڵگای ئێرە دەبینینو، پێویستە ئەو ئەزموونو شتە چاکانە بەرینەوە بۆ ئەوێ، مادام پێویستییمان پێیان هەیە، کەواتە نابێ لە ڕووداو و گۆڕنکارییەکانی عێراقو کوردستان بێ ئاگابین.

دووەم: نابێ لە کەسوکارو خزمو دۆستو هاوەڵو بنەماڵەمان دابڕێین، بۆ وێنە: جێبەجێکردنی سیلەی ڕەحم کە بێگومان ئەرکێکی زۆر گەورەو گرنگە، من زۆر کەس دەناسم دایكو بابی هەیە، براو خوشکی هەیە، خزمو کەسی هەیە، دۆستو هاوەڵی هەیە، بەڵام لێیان دابڕاوەو هەستو سۆزی زۆر کەم بووەو پەیوەندیی خزمایەتییو کۆمەڵایەتیی زۆر کز بووە، بۆیە هەست بەتەنیایی دەکات، وە ڕەنگە تووشی حاڵەتی نەخۆشیی دەروونیی بووبێ، وەك خەمۆکییو دڵەڕاوکێ، کاکە دووجار بگەڕێوە وڵاتی خۆتو بچۆوە سەر لە خزمو کەسو کارت بدەو سەلامێکیان لێبکەو هەواڵێکیان بپرسە، ڕەنگە ئەو حاڵەتە نەفسییەت نەمێنێ وە لەخەمۆکییو دڵەڕاوکێو دڵتەنگیی ڕزگارت ببێ، چونکە ئاگات لەوێ نەماوە بۆیە وات لێهاتوە، ئنجا خەڵکی ئێرەش وەنەبێ هەموو شتێکیان باش بێ، ئەو لێکهەڵوەشانی شیرازەی خێزانو ژیانی تەنیاییو سستی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی، زۆر نەخۆشییو گرفتاریی بۆ دروست کردوون، کە بۆ خۆشتان دەزانن زۆرجار خەڵکی ئێرە حەسوودیی بە ئێوە دەبەن، کاتێك کە لەماڵی کوردێك یان ماڵی ڕەوەندێکی دیکە، کۆمەڵە کەسێك بەبێ موناسەبە کۆدەبنەوەو بانگهێشت (دعوة)ی یەکدی دەکەنو هەواڵی یەکدی دەپرسن، زۆریان پێ سەیرە دەڵێن: ئەوەچی قەوماوە؟! چونکە ئەوان ئەگەر بۆنەیەکی تایبەت نەبێت، جەژن نەبێ، ئاوا کۆنابنەوە، دەبێ ئاگامان لەوەبێ کە ئەو حاڵەتە کۆمەڵایەتییەی ئێرە نابێ لە خزمو کەسو دۆستو خۆشەویستانمان دابڕێ، بەتایبەت ئێستا کە هۆیەکانی

پەیوەنـدیی زۆرو جۆراوجۆرن، وەك مۆبایـلو ئێنتـەرنێت، دەبـێ هەمیشە لەگەڵیان لە پەیوەندیی دابین.

ئنجـا کـە دەچـینەوە بـۆ عێـراقو کوردسـتان، یـان دەمانـەوێ بـچینەوە، پێویـستە شـتی بـاش لەگـەڵ خۆمـان بەرینـەوە، مەبەسـتم شتی ماددیی نیە، کە ڕەنگە خـەڵکێك زیـاتر ئـەو لایەنـە لەبەرچاو بگرێـت، مەبەسـتم ئەوەیـە کـە ئێمـە تەماشـای ئـەم خەڵکـەی ئێـرە دەکـەینو سـەرنجی ژیـانو گـوزەرانی دەدەیـن، بـەڵێ ئێمـە لـەڕووی دینییو ڕۆحییو ئەخلاقییـەوە، ڕەخنـەو تێبـینی زۆرمـان لەسـەریان هەیە، بـەڵام بەڕاستی لـەڕووی ماددییو سیاسییو ئیدارییو لـەزۆر شتدا لەپێش ئێمەوەن، کەواتە با ئەو شتە چاکانەیان لـێ فێـر بـینو بـۆ وڵاتەکـەمانیان بـەدیاری بەرینـەوە! بـراو خوشـکە بـەڕێزەکانم! بەڕاستی من زۆر سەرم دەسوڕمێ کـە دەبیـنم لێرەوە هونەرمەنـدێك گۆرانی بێژێك کە دەگەڕێتەوە زۆر لـە پێویـست بـەدەر قـەدرو ڕێـزی لـێ دەگرن، وێنەکەی هەڵدواسن بەگەرمی پێشوازیی دەکـەن، خـەڵاتی دەکـەن، ئنجـا بێئەنـدازە دەوڵەمەنـد دەبێـت کۆشـكو تـەلاری بـەرز دروسـت دەکـات! بـەڵام بـا هەرکەسـە بـە ئەنـدازەی خـۆی ڕێـزی لـێ بگیرێ، پێویستە ڕێزی زۆر بگیرێ لە کەسانی زانـاو شـارەزاو پـسپۆڕی بوارە جیاجیاکان، ئەوانەی بڕوانامەی بەرز وەردەگرن لە زانستەکانی کیمیاو فیزیاو کۆمپیوتەرو پیشەسازییو پزیشکییو ئیدارەو ...هیتد! بـەڵێ ئێمـە پێویـستمان بـە هونـەرو ئـەدەب هەیـە، واتـە: هونـەرو ئـەدەبی پابەنـد (ملتـزم)، هەرچـەندە پـەکمان لەسـەر ئـەوەی ئێـرە نەکەوتوە، چونکە، ئێمەش خاوەنی هونەرو ئەدەبی خۆمانینو بەشی خۆمـان کلتـوورو فیکـرو فەرهـەنگمان هەیـە، بـەڵام ئێمـە بەڕاسـتی

پەکمان لەسەر ئەو بەهاو ئەزموونە ماددییانە کەوتوە، کە خەڵکی ڕۆژئاوا ژیانی دونیای خۆیان پێ ڕێکخستوون، پێویستیمان بە تەکنۆلۆژیای ئەوانە بۆ دروستکردنی ژێرخانی وڵاتەکەمان، پێویستیمان بە ئەزموونی سیاسیی‌و سیستەمی حوکمڕانیی ئەوانە، تەماشا دەکەین لێرە دەستەڵاتی سیاسیی دەستاودەستی پێدەکرێ، کە ئەوە شتێکە ئیسلام فەرمانی پێکردوە، هەرچەندە ڕەنگە زۆر کەس وابزانن شەریعەتی ئیسلامیی پەیوەندیی بەسەر سیاسەت‌و حکمڕانیی‌و دەستاودەست پێکردنی دەستەڵاتەوە نیە! لەکاتێکدا کە ئەوە بنەمایەکی گەورەی شەریعەتە کە فەرمانی پێکراوەو چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هەڵبژاردنی مسوڵمانان دیاریی کراون، بۆیەش ناونراون (الخلفاء الراشدون) خەلیفە سەرراستەکان‌و پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمانی کردوە بە شوێنی هەلگرتن‌و چاولێکردنیان: (...فعليكم بسنّتي وسنّة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي، عضوا عليها بالنواجذ) رواه أهل السنن.

کەواتە: لە سیستەمی حوکمڕانیی ئێرەدا ئەوەی ئیسلام دەیەوێ لە شێوازی دانانی حوکمڕان‌و دەستاودەست پێکردنی دەستەڵاتدا، جێبەجێ دەکرێ، بەڵام لای ئێمە کابرا خۆی بە مسوڵمان دەزانێ، کەچی شێوەی حوکمڕانییەکەی یان میراتییە، یان حوکمێکی دیکتاتۆریی، کە بێگومان ئەوە پێچەوانەی شەریعەتی خوایە!

کەواتە: با ئێمە ئەزموونی سیاسیی لێرەوە فێربین، با لایەنی ئیدارەو بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لێرەوە وەربگرین، کە دەبینین هەموو شتێك بە دوگمەیەو، ڕێکخراوەو سەرەوبەرەی تێدایەو، کەس ناتوانێ

زوڵم لە کەس بکات، بەڵێ با ئێمە هەموو شتێکی باش‌و بە کەڵکیان لێوە فێربین‌و وڵاتی خۆمانی پێ ئاوەدان بکەینەوەو بەرەو پێش بەرین، با ئێمە وەك هەنگ بەدوای شیلەی گوڵاندا بگەڕێین، نەك بە پێچەوانەوە ببینە مێشە ڕەشەو بەدوای شتی پیسەوە بین‌و، بەسەر خاڵە ڕەشەکانەوە بنیشن! کە بەڕاستی ئەوە نە بەکەڵکی خۆشمان دێ‌و نە بەکەڵکی نەتەوەکەشمان دێ، دەبێ لەوەشدا سەرکردایەتی سیاسییمان زۆر وریابێ، چونکە وەك زانایەك دەفەرموێ: دەستەڵات وەك بازاڕ وایە تێیدا ڕەواج بە هەرشتێك بدرێ ڕمێن پەیدا دەکات! دەبێ دەستەڵاتی سیاسیی گرنگی زۆر بدات بە زانایانی بلیمەت‌و داهێنەر، کە بێگومان ئێمەش خەڵکی زاناو شارەزامان هەیە، لە بواری تەندروستیی‌و پزیشکییدا، لە گەردوون ناسییدا، لە کیمیاو لە فیزیادا، لە بواری ئیدارەو لەبوارەکانی دیکەدا، خەڵکی پسپۆڕو ئەکادیمیی‌و شارەزای بوارە جیاجیاکان، ئەوانە ئەگەر ڕێزیان لێ بگیرێ‌و پێشوازیی بکرێن‌و زەمینە سازییان بۆ فەراهەم بهێنرێ، لە تواناکانیان بەهرەمەند دەبین، ژێر خانی وڵات‌و لایەنی پیشەسازیی‌و ئابووریی‌و ئیدارەمان پێش دەکەوێ.

کەواتە ئێمە ئەوەندەی کە لێرەین با هەوڵبدەین، هەرچی شتی سوود بەخش‌و چاکە لێیان فێربین‌و میللەتی خۆمانی لێ بەهرەمەند بکەین، نەك خوا نەخواستە چاومان لە شتە خراپەکانیان بێ، دیارە هەمیشە شتی خراپیش ئاسان وەردەگیرێ، بەتایبەت بەرگ‌و پۆشاك‌و داب‌و نەریت، کە هیچ خۆماندووکردن‌و خوێندن‌و زانست‌و فەلسەفەی ناوێ، پۆشاکی وەك هی ئەوان لەبەر بکەو هیچی تێناچێ زۆر ئاسانە، بەڵام نا، با ئێمە خۆمان ماندوو

بکەین‌و شتی چاك فێربین‌و وڵاتەکەمانی پێ بەرەوپێش بەرین‌و ئەگەرنا بێگومان شوێنکەوتنی شتی خراپ‌و بێ کەڵك‌و لاسایی کردنەوەی کوێرانە، بەهیچ سەرەنجامێکی باشمان ناگەیەنێ‌و، هەڵبەتە مەبەستی پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم کە بە سەرزەنشتکردنەوە بە ئۆممەتی فەرمووە: {لتتبعُنَّ سنن من كان قبلكم شبراً بشبرٍ وذراعاً بذراعٍ، حتى لو دخلوا جحر ضببٍّ لَدَخَلْتُموه} متفق عليه، واتە: دەکەونە دوای ڕێ‌و شوێنی ئەوانەی پێش خۆتان بست بە بست‌و باسك بە باسك، تەنانەت ئەگەر چووبنە کونی بزن مژەیەکیشەوە، دەچنە نێوی، هەر مەبەستی پێ ئەو جۆرە چاولێکەریی‌و لاسایی کردنەوەیەی مسوڵمانان بووە، بۆ لایەنە سلبیی‌و شتە خراپ‌و زیانبەخشەکانی میللەتانی نا مسوڵمان بەگشتیی‌و جوولەکەو نەصرانییەکان بەتایبەت، وەك لە فەرموودەی ڕاست (صحيح)دا هاتوە، کە کاتێك پرسیار لە پێغەمبەر کراوە لەبارەی ئەوانەوە کە مسوڵمانان پێیان کارتێکراو (متأثر) دەبن، بەباری خراپەدا، کە ئایا مەبەستی جوولەکەو نەصرانییەکانە: (اليهود والنصارى؟) فەرموویەتی: (فَمَنْ؟) واتە: ئەدی جگە لەوان کێم مەبەستە؟! وەك (بخاري و مسلم) هێناویانە.

# تـەوەرەی پێنجـەم

## ئەرکی سـەرشانی ڕەووەندی کورد بەرانبـەر بە خەڵکی ئەم وڵاتانە کە لەژێر سـایەیاندا ژیان بەسەر دەبات

خوشكو برایانی بەڕێز!

ئێمـە بەرانبـەر بەخـەڵکی ئـەم وڵاتانـەش ئـەرکمان لەسەرشـانە، هەڵبەتە ئەوە هەر قسەی ئێسـتام نیـە، بـەڵکو ئەنـدامانی (کۆمـەڵی ئیـسـلامیی) دەزانــن، کــە مــن نامیلکەیــەکم هەیــە ســاڵی (٢٠٠٢) نووسـیومە بـەناوی: (چـەند ڕێڕوونییـەك بـۆ خوشـكو برایانمـان لـە هانـدەران)، لەوێـشدا باسـم کـردوە، کـە کەسـێك دێ بـۆ ئێـرە چـەند ئەرکێکی لەسەر شـانە:

سەرەتا هەرکەسێك کە دێ بۆ ئێـرە دیـارە میـوانی ئـەم وڵاتەیـەو، میوانیش دەبـێ ئـادابی میوانـداریێتی ڕەچاو بکات، واتـە عـادەت وایـە میوان کە دەچێتە ماڵێك تەماشـای دەمـی خانـەخوێ دەکات، خـاوەن ماڵ ڕێو شوێنی بـۆ دیـاری دەکـات، پێـی دەڵـێ: لێـرە دانیـشەو لـەوێ دامەنیشـە، ئاوا بکەو ئاوا مەکە، لێرە دەست بـشۆو، لـەوێ نـان بخـۆو، لـە فـلان جێگایـە دابنیـشەو، لـە فـلان شـوێنە بخـەوەو...هتـد، بابـای میــوانیش پابەنــدەو دەڵــێ بەسەرچــاو، ئێمــە دەبــێ لــەم وڵاتانــەدا پابەنــدبین بــە یاســاو ڕێــساو سیــستەمی ئیــداریی تایبــەت بــە خۆیانـەوە، هەڵبەتـە بۆیـە ئامـاژەش بـەم مەسـەلەیە دەکـەم، چـونکە

بیستوومە خەڵکێك هەیە بەناوی ئیسلام، یان بەناوی تەوژمی ئیسلامییەوە گوتوویانە: مادام ئێرە کافرەستانەو ئەو خەڵکە نامسوڵمانە، ئەگەر دزییان لێ بکەی و فێڵ و خیانەتیشیان لێبکەی، هەر دروستە !

بەڵام نەخێر، ئەوە ڕاست نیەو ئەسڵی نیە، مسوڵمان ئیسلام فەرمانی پێدەکات، کە دەبێ پابەندبێ بەو پەیمان و بەڵێننامەیەوە کە بە تەڕەفی بەرانبەری داوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ...﴿١﴾ ﴾ المائدة، تۆ کە دێی بۆ ئێرە ڤیزەت دەدەنێ، یان حەقی ئیقامەو مانەوەت دەدەنێ، دیارە ئەوە کۆمەڵێك مەرجی هەن و دەبێ ئەو مەرجانە جێبەجێ بکرێن، ئەگەرنا مانای وایە درۆیان لەگەڵ کراوەو وەعدەیان لەگەڵ جێبەجێ نەکراوەو خیانەتیان لەگەڵ کراوە، کە دیارە لە ئیسلامدا لە حاڵەتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەشدا غەدرو خیانەت و پەیمانشکێنیی دروست نیە، چ جای لەگەڵ کەس و لایەن و دەوڵەتێکدا کە لەگەڵی لە مامەڵەدای و هاتووی بۆماڵەکەی و زۆریشت پێویست پێیەتی !

بێگومان ئەوە خاڵێکی زۆر گرنگە، دەبێ ئێمە وەفادارو ئەمەکدار بین لەگەڵ خەڵکی ئێرەو، پابەند بین بەو سیستەمە ئیدارییەی ڕێکیان خستوە، بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و کۆمەڵگای خۆیان، کە هیچ تێکگیرانێکیشی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیدا نیە، چونکە ئەو شتە ئیدارییانە لە بازنەی شتی ڕێ پێدراو (مباح)دان، کە دەستی ئینسان تێیدا کراوەیە، چونکە زاناو شارەزایانی ئیسلام گوتوویانە:

(الأصل في العادات الإباحة)، واتە: بناغە لە هەڵس و کەوتەکاندا ڕێپێدرانە[1]، کە دیارە سیاسەتی شەرعییش لە بواری هەڵس و کەوتەکاندایە.

بەڵکو سەرەڕای وەفاداریی و بێ زەرپبوون دەبێ لەگەڵیاندا چاکەکار بین، چونکە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الرحمن، واتە: ئایا پاداشتی چاکە جگە لە چاکە شتێکی دیکە هەیە؟! واتە: تۆ کەسێك چاکەت لەگەڵ دەکات، تۆش چاکەی لەگەڵ بکەوە، وەك لە شوێنێکی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ ...﴿٨٦﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەگەر سڵاوتان لێکرا، بە شێوەیەکی چاکترلەخۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

کەسێك ڕێزت لێ دەگری و دەڵێ: فەرموو، دەبێ تۆش ڕێزی لێبگریەوە، هاوکارییت دەکەن دەبێ هاوکارییان بکەیەوە، واتە: هەرشتێك کە دەبێتە هۆی خێرو قازانج گەیاندن بە خەڵکی ئەم وڵاتەی لێی دەژی، تۆ وەك دینداریی، پابەندو مولزەمی، کە ئەنجامی بدەی، وەك چۆن خەڵکی ئەم وڵات و دەوڵەتە چاکەیان لەگەڵ کردووی، تۆش چاکەیان لەگەڵ بکەوە، نەك بڵێی: مادام ئێرە

---

١) بڕوانە: (القواعد النورانية الفقهية)ی (إبن تيمية) ص: (٧٩)، کە دەڵێ: (الأصل في العادات العفو)، هەروەها بڕوانە: (أصول الفقه المهمة)ی (عبدالرحمن بن ناصر السعدي)، کە دەڵێ: (الأصل في العادات الإباحة الا ما ورد عن الشارع تحريمه...) ص: (١٠٦).

کافرستانە، هەرچی بیکەم ڕەوایە! چونکە خوای دادگەر بەدەقی ئایەت دەفەرموێ: ﴿ ...وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ...﴿٨٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: چاکە بە خەڵك بڵێن، چی چاکەیە لەگەڵ خەڵکیدا باسی بکەن بەگشتی، وە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة، واتە: خوا ڕێگاتان لێناگرێ وە لێی قەدەغە نەکردوونە، کە چاکە بکەن‌و هاوکاریی بکەن، لەگەڵ کەسانێکدا کە دژی دین‌و ژینتان نین‌و، لە وڵاتی خۆتان دەرتان ناکەن، بەڵکو خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم لەوبارەوە دەفەرموێ: (لايشكر الله من لم يشكر الناس)، رواه الترمذي، واتە: هەرکەسێك سوپاسی خەڵك نەکات، سوپاسی خواشی بۆ ناکرێ، چونکە چاکەی خەڵك بچووکترە لە هی خوا، چاکەی خوا زۆر گەورەیە، جا ئەگەر تۆ سوپاسی چاکەیەکی بچووك نەکەی، سوپاسی چاکەی گەورەت هەر پێ ناکرێ، وەك کوردەواریی خۆمان گوتوویانە: هەڵگرتنی بەردی گەورە نیشانەی پێدا نەدانە !

پاشان خوای پەروەردگار لەسەری پێویست کردووین، کە هەرچی چاکەیەو سوودی بۆ خەڵك هەیە، ئێمە تێیدا دەستبار بگرین، جا لایەنی بەرانبەر هەرکەسێك بێ، کافر، مسوڵمان، جوولەکە، نەصڕانیی، زەردەشتیی، هاوبەش پەیداکەر...هتد، مادام بۆ شتێکی چاکە بڵێ: وەرە پێکەوە ئەنجامی بدەین! پێویستە لەسەرت دەستبار بگری،

وەك دەفەرموێ: ﴿ ...وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ...﴿٢﴾ ﴾ المائدة، واتە: هاوکاریی کاری یەکدیو دەستبارگریی یەکدی بن بۆ هەر شتێك کە چاکەیە (بۆ خەڵك)و پارێزکارییە (بۆ خوا).

ئنجا وەك لە تەوەرەی پێشوودا باسم کرد، پێویستە لە هەرچی چاکەو شتە باشەکانی ئەم وڵاتانەیە بەهرەمەندبین، وەك پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (الحكمة ضالة المؤمن أينما وجدها فهو أحق بها)، رواه الترمذي[1]، واتە: زانیاریی بەسود لە ئینسانی مسوڵمان بزر بووە (لێی ون بووە) لە هەر شوێنێك بیدۆزێتەوە لە هەموو کەسێك زیاتر حەقی پێوەیەتی.

هەروەها خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ ...فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ ...﴿١٨﴾ ﴾ الزمر، واتە: دەجا موژدە بدە بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام دوای ئەوە دەکەون کە لە هەمووی چاکترو سوود بەخشترە.

کەواتە هەرچی شتی چاکی ئەم وڵاتانەو خەڵکی ئێرەیە دەبێ وەریبگرینو هەستیارییمان بەرانبەری نەبێ، نابێ بڵێین: ئاخر ئەم خەڵکە کافرو نامسوڵمانن، چونکە مەرج نیە هەر کەسێك کافر بوو، هەموو سیفەتەکانیشی کافرانەبن، وە مەرج نیە هەرکەسێك مسوڵمان بوو، هەموو سیفەتەکانیشی مسوڵمانانە بن، مسوڵمان

---

١) هەرچەندە ئەم دەقە لەڕووی سەنەدەوە پسپۆڕانی بواری سوننەت ئیشکالیان لەسەری هەیە، بەڵام لەڕووی نێومرۆك و (متن)ەوە ڕاستەو هیچ گریێو گۆڵی نین.

هەیە بەناو مسوڵمانە، بەڵام سیفەتی کافرانی هەیە، وە کافریش هەیە سیفەتی مسوڵمانی هەیە، بۆ وێنە: دادگەریی (عدل) سیفەتێکی ئیسلامییەو چەندان ئایەت فەرمانیان بە دادگەریی کردوە، جا حوکمڕانێکی کافر ئەگەر دادگەر بوو، دەبێ من دادگەرییەکەی لێوە فێربم، بەڵام حوکمڕانێکی مسوڵمان ئەگەر ستەمکار بوو، دیارە ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتیو لێی وەرناگیرێ، کەواتە: دادگەرییە باشەکەی کافرەکە وەربگرەو ستەمە خراپەکەی ئەو مسوڵمانە ڕەفز بکە، وەك گوتراوە: (أنظرو إلى ما قيل، ولا تنظروا إلى مَن قال)، واتە: تەماشا بکەن چی دەگوترێ، تەماشا مەکەن کێ دەیڵێ !

کەسێك شتی باشی پێیەو شتی باش دەڵێ، شتە باشەکەی لێ وەربگرەو خۆشت لە کەمو کوڕییەکانی بپارێزە.

بێگومان خەڵکی ئەم وڵاتانە لە سەر بناغەی ماددە گەراییو بە ئاژەڵ تەماشاکردنی ئینسان بنیات نراوە (دیارە کەمو زۆریش هەندێك کاریگەریی دینی هەر لەسەر بووە) کۆمەڵێك ڕەوشتو ئاکارو ڕەفتاریان تێدا پەیدا بووە، کە خۆشیان بەدەستییەوە گیرۆدە بوون، وەك: ڕەحم ساردبوونی ژنو مێرد لەسەر یەکدی، هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان، کزبوونو لاوازیی هەستو سۆزی منداڵو دایكو باب، پچڕانی سیلەی ڕەحمو خزمایەتیی، تەنیا بیرکردنەوەی لە گەدەو گیرفانو داوێن، تەنیا بایەخدان بە لایەنی ماددییو فەرامۆشکردنی لایەنی ڕووحییو مەعنەویی، ئەوانە هەموویان کۆمەڵێك دەردو نەخۆشیین، کەموکووڕیین، دەبێ خۆمان لە کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو شتانە بپارێزین، بەڵام لە چاکەکانیان

بەهرەمەند بین، نەك بێین بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێك چاکەیان لێ دەبینین، خراپەکانیشیان وەربگرین، هەر وەك نابێ لە سۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەڵێك خراپەو کەموکوورییان لێ دەبینین، بچین چاکەکانیشیان فڕێ بدەین، بەڵکو چاکە بەجێی خۆیو خراپەش بەجێی خۆی !

ئەمە ئەوە ئەو بابەتە بوو کە من ویستم لەو پێنج تەوەرەیەدا پێشکەش بە ئێوەی بەڕێزی بکەم، هیوادارم وەك لە دڵی خۆمدا وایە ئێوەش قسەکانی منتان ئاوا وەرگرتبێ، پێویستیش ناکات کە من خوا بە شاهید بگرم بۆ کەس، کە بێجگە لە دڵسۆزیی هیچ هاندەرێکی دیکەم نیەو، تەنیاو تەنیا بە هاندەری ئیمانییو ئیسلامیی ئەم قسانە دەکەمو، پەرۆشی میللەتی خۆمەو بەزەییم پێیدا دێتەوە، بە مەزلوومی دەزانم، بەڕاستی میللەتی خۆمان زۆر دواکەوتوە لە زۆر لایەنەوەو بێگومان پێشیش ناکەوێ، ئەگەر هەمووومان دەستبارگری یەکدی نەبین، بۆ ئەوەش پێویستە لە هەموو ڕوویێکەوە پێشی بخەین لە هەموو ڕووەکانی فیکرییو عەقیدەیی، ئەخلاقیی، سیاسیی، ئیداریی، ئابووریی...هتد، واتە: ئێمە پێویستیمان بە گۆڕانکارییو شۆڕشێکی هەمە لایەنەیە، کێشە هەر ئەوە نیە بگوترێ: ئەوە قەوارە فیدراڵییەکەمان لێ سەلمێنراوەو هەرێمی کوردستانمان جیا کردەوە، نا بەڵکو پێویستە بزانین لەو چوارچێوەیەدا چی دەکەین، دادگەریی دەچەسپێنین یان ستەم دەکەین؟ چاکەکاریی یان خراپەکاریی؟

زۆر گەلو نەتەوە هەن دەوڵەتیان هەیە، بەلام بەدەست خۆیانەوە گیریان خواردوە، ئەوەش بەڕاستی بە هەموو لایەك

دەکرێ، نەك هەر بە سەرکردایەتی سیاسیی، هەمووشمان بەرانبەر بە گەل‌و نەتەوەی خۆمان بەرپرسیارین.

خوای پەروەردگار سەرەنجامی هەموو لایەکمان بەخێر بگێڕێ‌و، دەرووی خێرمان لێ بکاتەوە، ئێوەش خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵتان سەلامەت‌و پارێزراوبن، لە هەڵدێران‌و هەڵخلیسکان‌و شەرمەزاریی‌و عەیبداریی‌و گوناحباریی‌و دونیاو قیامەت.

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

دواپێداچوونەوە شەوی

٢٠١١/١١/١١

هەولێر

## بەرهـەمـەكانی دانـەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچكان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- كۆمەڵی خـــوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێ‌یەوچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ كامەیە؟!. چاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینـی: دواتـر خرایـە نێـو كتێبـی (مـسوڵمانی كـامڵ: بەشـی یەكـەم: بیـروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئـەمیش خرایـە نێـو كتێبـی (ئیمـان‌و عەقیدەی ئیسـلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صاڵح بوون‌و بەرەو خوا چوون. چاپی ٣ /٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی‌و لەژێر چاپە.

٩- كوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوكمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سـۆزی نەتەوایـەتی‌و بیـری ناسـیۆنالیزم لـە تـەرازووی ئیـسـلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١٢- مسـوڵمانی كامڵ/ بەشی یەكەم: بیـروبڕوای مسـوڵمان. چاپی ١/١٩٩٧

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسـەری كێشـەی كورد لە نێوان ئیمان‌و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنـەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان‌و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەکی گەشو ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلامو کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بە گشتی، پاكوخاوێنی.

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن.

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشینو زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەجو عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن ؟!. چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟ چاپی ٢ /٢٠١١

٢٩- بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی ٣ /٢٠١١

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاساو و بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا. چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك.چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی

ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٤٤- ئیسلامو مسوڵمانەتیوکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چییەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگاریێتی دا. ١٣ تا ٢٦. چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراویێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّوجل)، کتێبەکانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاه والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٩- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندییو دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠. چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٢- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتییو لاسایی کردنەوەدا.

٥٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین ؟

٥٤- سیاسەتی ئیسلامییو چەند ڕوونکردنەوەیەك.

٥٥- چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی.

٥٦- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی.

٥٧- قوتابیانی زانیاری شەرعیی چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك.

٥٨- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە.

٥٩- بانگەواز بۆ لای خوا .

٦٠- قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟!

٦١- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية). کە دوایی لە شێوەی ناميلکەدا چاپ کراوە.

٦٢- حوار خاص (مقابله مع قناه العالم). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

٦٣- خواناسیی، ئایین ، ئیمان. چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .

٦٤- واقیعی هەرێمی کوردستان ...دیدێکی ئیسلامییانە. چاپی ١/ ٢٠٠٨ .

٦٥- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا. چاپی ١ /٢٠٠٨

٦٦- چۆن باشتر لە کتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟! چاپی ١/ ٢٠٠٨، چاپی ٣ /٢٠١٠

٦٧- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵ دا.

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٦٨- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چاپی ١/٢٠١٠، چاپی ٢/ ٢٠١١.

٦٩- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا .

٧٠- کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك.

٧١- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك.

٧٢- مەلای گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك.

٧٣- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان .

٧٤- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئان دا.

٧٥- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الأول.

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپن

١، ٢، ٣، ٤- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الثاني والثالث والرابع والخامس.

٥- خاتوو عائیشە دایکی بڕواداران.

٦- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی.

٧- طريق الصلاح والسَّير الى الله تعالى.

٨- خوشك‌و برایانمان لە هەندەران و ئەرکی سەرشانیان.

## ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن.

١، ٢، ٣- الإسلام كما يتجلى فى كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد ٦و٧و٨ .

٤- خووو ڕەوشتی ئیسلامیی.

٥- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەتدا. بەرگی دووەم.

٦- گرنگیی‌و پێویستی پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە.

٧- ئیسلام‌و دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی.

# نـیـوەڕۆك